# ذم الكلام وأهله



دەرخستنی ڕووی ڕەشی
ئەشعەریە جەهمیە زەندیقەکان

ئامادەکردنی :

الشاب السني

١٤٤٥ هـ

پێشەوایانی ئیسلام و سوننەت لە مەترسی ئەم جەهلە بۆ سەر ئیسلام ئاگاداربوون بۆیە هەموویان کۆکبوون لەسەر ڕێگریکردن لە سەیرکردن و وردبوونەوەی، یان فێربوونی یان فێرکردنی، لەبەرئەوەی هیچ خێرێک ناهێنێت، وە خاوەنەکەی هەرگیز سەرفراز نابێت ئەگەرچی بیشیەوێت بەم کارەی سوننەت سەربخات، سوننەت بەم عیلمە سەرناخرێت، بەڵکو بە ئایەت و حەدیث و ئەثەر سەرئەخرێت، وە بە کەسێک نەوتراوە عالم ئیللا بە فێربوونی کیتابی الله تعالى و سوننەتی رسول ﷺ و ئەوەی سەلەف لەسەری بوون، ئەگەر بێتو پیاو فێری جەهلی کەلام و مەنطیق بێ تا وای لێبێت بگاتە ئەوپەڕەکەی ئەوا بە زانا دانانرێت، بەڵکو تووشی پەکخستن و زەندەقە ئەبێت

١ - أبو حاتم الرازي (٢٧٧ ه) ئەڵێ :

(هشام بن عبيدالله کاتێک چووە لای المأمون پێی وترا قسە لەگەڵ بشر المريسي بکە، وتی: الله چاکت بکات خەلیفە، کەلامەکەیم پێ باش نیە، **زانا بە کەلامەکەی ئەو لای ئێمە جاهلیە)** .

**(الإبانة الكبرى : ٦٦٩)**

---

**: و اتا ئەوکەسەی عالم بێت بە کەلام ئەوە جاهیل ونەزانە لەلای ئەهلی سوننە ئەگەر چی خەڵکی بە گەورەی بزانن، لەلای سەلەف و ئەهلی سوننە زانای ڕاستەقینە ئەوزانایەیە کە شارەزایە بە قورئان و فەرموودە و ئاثارو عەقیدەیان لەسەربنیاد ئەنێت .**

٢ - قوام السنة الأصبهاني (٥٣٦ هـ) بابێکی داناوە بەناوی :

(ڕوونکردنەوەی ئەو کارانەی پیاو پێی ئەبێت بە پێشەوا لە دیندا، وە **ئەهلی کەلام لە زانایان نین)** .

**(الحجة في بيان المحجة : ٣٠٦/١)**

٣ - ابن عبدالبر(٤٦٣ هـ) ئەڵێ :

**(ئەهلی فیقهـ و ئەثەر لە هەموو ناوچەکان کۆکن لەسەر ئەوەی ئەهلی کەلام ئەهلی بیدەع و زەیغن، هەموویان کۆکبوون لەسەر ئەوەی لە چینی فەقیهەکان دانانرێن، بەڵکو زانایان بریتین لە ئەهلی ئەثەرو تێگەیشتن لێ)** .

**(جامع في بيان العلم : ٩٢٤/٢)**

---

: ابن عبدالبر ئەهلی سوننە نیە و بیدعەچیە بەڵام وەک دیارە کۆدەنگی نقڵ ئەکات، وە تاک بە تاکی جەهمی و موعتەزیلی و کوللابی و کەڕامی و ئەشعەری و ماتوریدیە جەهمیە زەندیقەکان ئەهلی کەلامن .

وتەی سەلەف و ئەوانەی دوای سەلەفیش دەربارەی ڕێگری کردن لە تێڕوانین و فێربوونی کەلام :

١ - هلال بن العلاء الرقي (٢٨٠ هـ) ئەڵێ :

(کاتێک دەرچووم بۆ بەصرە بۆ طەلەبی حەدیث باوکم بۆی نوسیم : ئەی کوڕی خۆم، حەدیث بنووسەوە، وە **وریای سەیرکردنی کەلام بە**، لەبەرئەوەی هشیم بۆی گێڕامەوە کە معاوية بن قرّة (١١٣ هـ) وەصیەتی بۆ إیاس ی کوڕی ئەکرد و ئەیوت : ئەی کوڕی خۆم، **وریای سەیرکردنی کەلام بە**، لەبەرئەوەی سەیرکردنی کەلام وەک سەیرکردنی ناوەڕاستی خۆر وایە، هەرکاتێک بینایيت زیاد بکات سەرلێشێواویت زیاتر ئەبێت) .

**(أحاديث في ذم الكلام وأهله : ص ١٠١)**

٢ - پرسیار کرا لە أبو جعفر الباهلي دەربارەی ڕۆچوون لە کەلامدا، وتی :

پرسیار کرا لە الأوزاعي (١٥٧ هـ) دەربارەی ئەوە، وتی :

**(دووربکەرەوە لە عیلمێک کە کاتێک گەشتیتە کۆتایەکەی بتدەنە پاڵ زەندەقە**، پابەندی شوێنکەوتن و لاسایی کردنەوە ببە) .

**(مختصر الحجة على تارك المحجة : ٢٢٤)**

: کۆتایی هەموو ئەهلی کەلامێک بریتیە لە زەندەقە و جەهمیەت، وە مەبەستی ئیمامی الأوزاعي ئەوەیە شوێن سەلەف بکەوە ووەکو ئەوان هیچ قسە لە کەلامدا مەکە و خۆتی پێوە خەریک مەکە، بەڵکو وەکو سەلەف لە دین تێبگە و لاساییان بکەرەوە لە عەقیدە و فیقهـ و هەموو شتێکی تریاندا .

## ٣ - عبدالله بن داود الخريبي (٢١٣ هـ) ئەڵێ :

پرسیارم کرد لە سفیان الثوري (١٦١ هـ) دەربارەی کەلام؟

وتی: (**واز لە باطل بهێنە**، تۆ چەندە لە حەق شارەزایت؟ شوێن سوننەت بکەوە و واز لە بیدعە بێنە) .

**(مختصر الحجة على تارك المحجة : ٢٢٣)**

---

**: و اتە تۆ جارێک چەندە شارەزای قورئان و فەرموودە و ئاثاریت هەتا پرسیاری کەلام ئەکەیت! ئەوە بیدعەیە و سەلەف بە هیچ شێوەیەک قسەیان تێدا نەکردووە جگە لە زەندیقەکان نەبێت، هەربۆیە تۆش واز لە باتڵێکی لەو جۆرە بهێنە .**

## ٤ - عبدالرحمن بن مهدي (١٩٨ هـ) ئەڵێ :

چوومە لای مالك (١٧٩ هـ) پیاوێکی لابوو کە دەربارەی قوڕئان و قەدەر پرسیاری لێ ئەکرد.

وتی : (لەوە ئەچێت تۆ لە هاوەڵانی عمرو بن عبید بیت، **الله عمرو بە لەعنەت بکات، ئەو ئەم بیدعەی کەلامەی داهێنا، ئەگەر بێتو کەلام عیلم بوو ایە ئاوا هاوەڵان و تابعین قسەیان تێدا ئەکرد وەک چۆن قسەیان کردووە لە ئەحکام و شەڕائیع، بەڵکو باطلە و باطل بەدوای خۆیدا ئەهێنێت)** .

**(مختصر الحجة على تارك المحجة : ٢١٢)**

**٥ - مالك بن أنس** (**١٧٩** ھ) ئەڵێ :

(هەرکەسێک هەوڵی فێربوونی **دین** بدات بە **کەلام** ئەوا **زەندیق** ئەبێت . . )

**(ذم الكلام : ٨٧٣)**

**٦** - پیاوێک هاتە لای **المزني** (**٢٦٤** ھ) پرسیاری لێکرد دەربارەی شتێک لە کەلام، وتی :

(من ڕقم لێیەتی، بەڵکو ڕێگری لێئەکەم وەک چۆن الشافعي ڕێگری لێکرد، گوێم لە الشافعي بوو وتی: پرسیارم کرد لە مالك دەربارەی کەلام و تەوحید، مالك وتی: مەحاڵە وا گومان ببرێت بە پێغەمبەر کە ئوممەتەکەی فێری خۆپاککردنەوە - چوونە تەوالێت و ئادابەکانی - کردبێت و تەوحیدی فێرنەکردبن، تەوحید ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (فەرمانم پێکراوە جەنگ بکەم لەگەڵ خەڵکیدا تا ئەڵێن لا إله إلا الله) ئەوەی خوێن و ماڵی پاراستووە حەقیقەتی تەوحیدە.

**(ذم الكلام : ١١٢٨)**

: بەڕاستی ئەم نقڵەی ئیمام الشافعي وبۆوتەکەی ئیمام مالک رحمهم الله تیرێکی ڕاست وڕەوانە بۆدڵی ڕەش وپیسی هەموو ئەوبەناوموتەکەلیمانەی کە بە درۆوە خۆیان داوەتە پاڵ ڕێبازی ئەم دوو ئیمامە، لەکاتێکدا سەد و هەشتا پلە لەوان جیاوان، وە باش بزانە موتەکەلیمە کافرەکان پێیان وایە جەهلی کەلام هیدایەت وتەوحید وڕێگای ڕاستە، هەربۆیە عەقیدەی کوفریەکەی خۆیانیان لەسەر بنیاد ئەنێن و قورئان و فەرموودە و ئاثارەکانیان پشتگوێ خستووە، موتەکەلیمە کافرەکان وەکو عەلمانیە کافرەکانی ئەمڕۆ وا ڕەفتارئەکەن کە رسول الله ﷺ دینەکەی بە تەواوی نەگەیاندووە وپێویستە ئەوان خۆیان شتانێک دابهێنن هەتا دین لەو کەموکورتیەکان ڕزگار بکەن لەکاتێکدا رسول الله ﷺ موسوڵمانانی فێری ئادابی تەوالێت کردووە چجای بگات وتەوحید ودەوڵەتداری! .

٧ - عبدالله بن المبارك (١٨١ هـ) ئەڵێ:

(هەرکەسێک **کەلام** وەربگرێت زەندیق ئەبێت).

**(الإبانة الصغرى)**

٨ - بە عبدالرحمن بن مهدي (١٩٨ هـ) وترا فلان کەس کتێبێکی داناوە لە سەر سوننەت بۆ ڕەددانەوەی فلان کەس.

وتی : (بە کیتابی الله و سوننەتی پێغەمبەرەکەی ڕەددی داوەتەوە؟)

وترا: بە کەلام

وتی : (**ڕەددی باطلێکی بە باطلێک** داوەتەوە) .

**(الحلية : ٩/١٠)**

---

: سەلەف رحمهم الله هێندە جەهلی کەلام لەلایان بێزراو بووە تەنانەت بۆڕەددانەوەی گومڕا و کافرەکانیش بەکاریانەهێنراوە، بەڵام ئەشعەریە جەهمیەکان عەقیدەی خۆیان لەسەر ئەو جەهلی کەلامە دامەزر اندووە و لەپێناویدا وتەی الله و رسول ـەکەی ﷺ ڕەت ئەکەنەوە .

## ٩ - عبدالرحمن بن المهدي ئەڵێ :

(هەرکەس طەلەبی عەرەبی بکات کۆتایەکەی موئەدیبە، وە هەرکەس طەلەبی شیعر بکات کۆتایەکەی شاعیرە کە هەجو ئەکات و ستایش ئەکات بە باطل، وە **هەرکەس طەلەبی کەلام بکات کۆتایی کارەکەی زەندەقەیە**، وە هەرکەس طەلەبی حەدیث بکات وە لەسەری بەردەوام بێت ئیمامە . . . )

**(ذم الكلام : ١٠٣٩)**

## ١٠ - الشافعي (٢٠٤ هـ) ئەڵێ:

(ئەگەر کەسێک وەسیەتی کرد دوای مردنی خۆی کتێبە عیلمیەکانی بدەن بە کەسێکی تر، وە لەناو کتێبەکاندا کتێبی کەلام ی تێدابوو، ئەوە وەسیەتەکە نایگرێتەوە، **چونکە لە کتێبە عیلمیەکان نین)** .

**(مختصر الحجة على تارك المحجة : ٢١٣)**

**: واتە خودی کەلام لە عیلم وزانست هەژمارناکرێت، بەڵام لەلای ئەشعەریە جەهمیە زەندیقەکان کەلام پێشئەخرێت بەسەر قورئان و فەرموودەدا، وە بە درۆ و بوختان خۆیان ئەدەنە پاڵ ئەوئیمامە بەڕێزە لەکاتێکدا ئەوەی لەسەریەتی بە کوفروزەندەقەی ئەزانێت .**

## ١١ - الشافعي ئەڵێ :

(ئەگەر خەڵکی بیانزانیایە چی لە کەلام و ئەهواء هەیە، لێی هەڵئەهاتن وەک چۆن لە شێر هەڵدێن) .

**(الحلية : ١١١/٩)**

**: ئیمامی الشافعي رحمه الله ڕاستی فەرمووە، چونکە کەلام وکتێبە کەلامیەکان کانگای شک وگومان وبەدرۆخستنەوەی الله تعالى وپێغەمبەرەکەیەکەتی ﷺ .**

## ١٢ - محمد بن داود ئەڵێ :

(تۆمارنەکراوە لە هەموو ماوەی ژیانیدا کە الشافعي قسەی کردبێت لە شتێک لە ئەهواء، وە نەدراوەتە پاڵی و پێوەی نەناسراوە، **لەگەڵ ئەو ڕق و بوغزەی هەیبووە بۆ ئەهلی کەلام وبیدەع)** .

**(ذم الكلام : ١١٢٦)**

١٣ - عبدالله بن أحمد بن حنبل لە باوکیەوە کە ئەڵێ :

(الشافعي کاتێک هەواڵێک جێگیر بووبوایە لای لاسایی ئەکردەوە و شوێنی ئەکەوت، **وە باشترین تایبەتمەندی کە تیایدا بوو ئەوە بوو حەزی بۆ کەلام نەبووە**، بەڵکو خەمی ئەو فیقهـ بووە) .

**(ذم الكلام : ١١٢٧)**

١٤ - الشافعي ئەڵێ :

(هیچ کەسێک نیە ڕووی کردبێتە کەلام و سەرفراز بووبێت) .

**(ذم الكلام : ١١٣٠)**

---

**: ئیمام ڕاستی فەرمووە رحمه الله، هیچ کەسێک نییە خوی دابێتە کەلام ئیللا چەندین شتی لە قورئان و فەرموودە ڕەتکردووەتەوە، وە کەوتووەتە ناو جەهمیەت و زەندەقە و پەکخستن وەکو ئەشعەریەکان .**

١٥ - المزني ئەڵێ :

(پرسیارم کرد لە الشافعي دەربارەی بابەتێک لە کەلام، وتی: پرسیاری شتێکم لێبکە کە هەڵەت کرد تیایدا بڵێم هەڵەت کرد، پرسیاری شتێکم لێمەکە کە هەڵەت کرد تیایا پێت بڵێم کافر بوویت).

**(ذم الكلام : ١١٣١)**

## ١٦ - محمد بن عبدالله بن عبدالحكيم ئەڵێ :

(الشافعي پێی وتم: ئەی محمد، ئەگەر پیاوێک پرسیاری لێکردی دەربارەی شتێک لە کەلام، وەڵامی مەدەرەوە، لەبەرئەوەی ئەگەر پرسیارت لێبکات دەربارەی دیەیەک ئەڵێیت درهەمێک یان دانقێک پێت ئەڵێ هەڵەت کرد، وە ئەگەر پرسیارت لێبکات دەربارەی شتێک لە **کەلام** پێت هەڵخلیسکا پێت ئەڵێت کافر بوویت) .

**(ذم الكلام : ١١٣٢)**

## ١٧ - المزني ئەڵێ :

گوێم لێبوو الشافعي بە ربيع ی ئەوت : ئەی ربيع سێ شتم لێوەربگرە: ڕۆمەچۆ لە هاوەڵانی رسول الله ﷺ، لەبەر ئەوەی پێغەمبەر لە ڕۆژی قیامەت مشتومڕت لەگەڵدا ئەکات، وە **سەرقاڵ مەبە بە کەلامەوە، لەبەرئەوەی من گەشتووم بە ئەهلی کەلام لەسەر تەعطیل** .

المزني زیادی کرد و ئەڵێ : وە سەرقاڵ مەبە بە ئەستێرەکانەوە لەبەرئەوەی ئەتبەن بۆ تەعطیل .

**(ذم الكلام : ١١٣٤)**

---

**: ئەستێرەکان مەبەستی ئەوەیە کە ئەمرۆ پێی ئەوترێت فەلەکناسی و خوێندنەوەی بورج .**

**١٨** - **المزني** ئەڵێ :

(مەزهەبی **الشافعي** بریتی بوو لە **ڕق لێبوونەوە لە ڕۆچوون لە کەلام**) .

**(ذم الكلام : ١١٣٥)**

**١٩** - حسين الكرابيسي ئەڵێ :

(پرسیارم کرد لە الشافعي دەربارەی شتێک لە **کەلام**، توڕەبوو و وتی: پرسیار لە **حفص الفرد** و هاوەڵانی بکە الله **ڕسوا** یان بکات) .

**(ذم الكلام : ١١٣٦)**

---

**: بەهۆی کاریگەربوونی الكرابيسي بە جەهلی کەلامەوە تووشی کوفر و زەندەقە و جەهمیەت بوو، وە لەلایەن زانایانی سەلەفەوە رحمهم الله تەکفیرکرا لعنه الله تعالى لعنة واسعة .**

**٢٠** - **الشافعي** ئەڵێ :

(مونازەرەی هیچ کەسم نەکردووە لە کەلامدا تەنها جارێک نەبێت، وە من داوای لێخۆش بوون لە الله ئەکەم لەوە ) .

**(ذم الكلام : ١١٤٦)**

**٢١ - الربيع** ئەڵێ :

(کاتێک الشافعي قسەی لەگەڵ حفص الفرد دا کرد حفص وتی قورئان مەخلوقە، الشافعي پێی وت کافر بوویت بە اللّٰه ی مەزن) .

**(ذم الكلام : ١١٥٥)**

---

**: حفص الفرد ئەهلی کەلام بوو لعنهم الله .**

**٢٢ - الزعفراني** ئەڵێ :

(الشافعي ڕقی لە کەلام ئەبووەوە و ڕێگری لێئەکرد) .

**(ذم الكلام : ١١٥٦)**

**٢٣ - الشافعي** ئەڵێ :

(دایکی المريسي پێی وتم: قسە لەگەڵ بشر دا بکە دەست هەڵبگرێت لە کەلام، قسەم لەگەڵیدا کرد، بانگی کردم بۆ کەلام) .

**(ذم الكلام : ١١٦٢)**

**٢٤ - الربيع** ئەڵێ :

(پیاوێک پرسیاری کرد لە الشافعي لە بابەتێکدا، الشافعي پێی وت : ئەمە بانگمان ئەکات بۆ کەلام، وە ئێمە وەڵامی هیچ شتێک نادەینەوە لە کەلام).

**(ذم الكلام : ١١٦٣)**

**٢٥ - يونس** ئەڵێ :

(چوومە لای الشافعي دوای ئەوەی لەگەڵ حفص الفرد قسەی کرد، وتی: ئەی أبا موسی، **گەشتم بە ئەهلی کەلام لەسەرشتێک کە هەرگیز خەیاڵت بۆی ناچێت، ئەگەر الله پیاو تووشی هەر شتێک بکات لەوانەی نەهی لێکردووە جگە لە شیرک باشترە لەوەی تووشی کەلام ببێت)** .

**(ذم الكلام ١١٦٤)**

---

**: ئەوەی یەهوودی و نەسرانیەکان کردیان بە تەورات و ئینجیل لە تەحریف کردن، لەچاو تەحریف و شێواندنەکەی ئەهلی کەلام هیچ نییە، ئەهلی کەلام گەیشتوون بە پلەیەکی باڵا لە کوفر و زەندەقەدا .**

**٢٦ - الربيع** ئەڵێ :

(الشافعي پێی وتم : ئەگەر بمویستایە لەسەر هەموو پێچەوانەکارەکانم کتێب دابنێم ئەمکرد، بەڵام کەلام لە ئاستی مندا نیە، وە پێم خۆش نیە کە شتێک لێوەی - واتە لە جەهلی کەلام - بدرێتە پاڵم) .

**(ذم الكلام : ١١٦٨)**

٢٧ - الزعفراني ئەڵێ :

(الشافعي بە عەمامەیەکی گەورە سەری پێچاپەوە وەک ئەوەی دەشتەکی بێت وە گۆچانێکی بە دەستەوە بوو، وە زمان پاراوترینی خەڵک بوو، وە کاتێک لە مەجلیسەکەیدا باسی **کەلام** بکرایە، ڕێگری لێئەکرد، وە ئەیوت : **ئێمە هاوەڵانی کەلام نین**) .

(ذم الكلام : ١١٦٩)

٢٨ - هەندێک لە هاوەڵانی الشافعي ئەڵێن :

(لای الشافعي ئامادە بووین، وە قسەی کرد لەگەڵ پیاوێکدا لە مزگەوتدا لە بابەتێکدا، مونازەرەکە درێژ بووەوە، پیاوەکە شتێکی وت لە کەلام، پێی وت: واز لەمە بێنە، لەبەرئەوەی ئەمە لە کەلامە) .

(ذم الكلام : ١١٧١)

٢٩ - یونس بن عبدالأعلى لە الشافعي ەوە ئەیگێڕێتەوە کە ئەڵێ :

هیچ تاوانێک نیە بەندە پێی بگاتەوە بە الله گەورەتر بێت دوای **شیرک** بۆ الله لەوەی پێی بگاتەوە بەم **کەلام** ە.

یونس ئەڵێ پێم وت: هاوەڵەکەمان اللیث بن سعد ئەیوت : ئەگەر پیاوێکت بینی لە ئەهلی کەلام بەسەر ئاوەوە ئەڕۆشت فریوی پێ مەخۆ و پێی سەرسام مەبە .

الشافعي وتی: کەمی وتووە، ئەگەر بینیت لە هەوادا ئەڕۆشت ریوی پێ مەخۆ و پێی سەرسام مەبە) .

(ذم الكلام)

**٣٠ - الشَافعي** ئەڵێ :

(هیچ کەسێکم نەبینیوە سەرقاڵ بووبێت بە کەلامەوە و سەرفراز بووبێت، ئەگەر پیاو تووشی هەموو تاوانێک ببێت کە الله ڕێگری لێ کردووە جگە شیرک، باشترە بۆی لەوەی تووشی کەلام ببێت) .

(الإبانة الكبرى : ٦٦١، مختصر الحجة : ٢١٥)

**٣١ - المزني** ئەڵێ :

(قورئان کەلامی الله یە غەیر مەخلوقە، هەرگیز نزیک نەبوومەتەوە لە الله بە جگە لەمە، وە هەرکەس بڵێت مەخلوقە ئەوە کافرە، وە **الشافعي ڕێگری ئەکرد لە کەلام**) .

(ذم الكلام : ١٢٢٦)

---

**: ئەم وتەیەی المزني زۆر دەقیقە، ئەڵێت الشافعي ڕێگری ئەکرد لە کەلام دوا تر خۆشی ئەڵێت ئەوەی بڵێت قورئان مەخلوقە کافرە کەو اتە لە سیاقی وتەکەی المزني مەبەستی ئەوەیە بۆیە الشافعي ڕێگری لە عیلمی کەلام کردووە لەبەر ئەو هەموو لەوازمە کوفریەی کە یەت بەدوا یا لە وتە و لە بیروباوەڕیشدا کە ئەم تەحزیرەش کوللابی و ئەشعەریەکان ئەگرێتەوە**

لعنهم الله لعنة واسعة لەبەر سەرقاڵ بوونیان بە جەهلی کەلام، بۆیە ناکرێت و ناگونجێت الشافعي وتبێتی من ڕقم لە میوەیە بەڵام تۆ بڵێی نەخێر ڕقی لە سێو و پرتەقاڵ نەبووە ئەو وتوویەتی میوە نەهاتووە دانە بە دانە بۆت دیاری بکات کەو اتە وتەکەی بۆ تەعمیمە، بۆیە مادام الشافعي رحمە الله بە کوللی و بەبێ استثناء ڕقی لە کەلام و ئەهلەکەی بووە و بوغز اندونی و ڕێگری کردووە دەربارەیان کەو اتە ئەشعەریەک و موعتەزیلەیەک و جەهمیەک و فەیلەسوفێکی یۆنان و هیند لعنهم الله لعنة واسعة یەک حسابن لای و هەموویان تووشی زەندەقە و ئیلحاد و کوفر بوون بە پێی وتەکانی الشافعي رحمە الله، ناشکرێت و ناگونجێت الشافعي تەئویل و تەعطیلی دەقەکانی کردبێت لەکاتێکدا پشتی لە جەهلی کەلام کردبێت چونکە ئەوەی ئەهلی تەعطیل لە هەموو سەردەمێکدا وەک مەقاش بەکاریان هێناوە بۆ تەئویل و تەعطیل و تەحریفی دەقەکانی قورئان و سوننەت جەهلی کەلام بووە، بۆیە ئەبێت لە کەسێکی هەستیاری وەک الشافعي رحمە الله کە ئێستا وکۆنیش ئەشعەریەکان لعنهم الله بانگەشەی ئەوە ئەکەن شوێنکەوتەی ئەو پیاوە بەڕێزەن موسڵمانی سونی شارەزا تربێت لە چاو ئیمامەکانی تردا لەبەرئەو هەستیاریەی هەیەتی رحمە الله .

## ٣٢ - الشافعي ئەڵێ :

(حوکمی من لەسەر **ئەهلی کەلام** حوکمی عمر ە لەسەر صبیغ، لێیان بدرێت بە قامیشی دارخورما، وە سواری حوشتر بکرێن، وە بگێڕدرێن لەناو عەشیرەت و هۆزەکاندا، وە بانگ بکرێت لەسەریان ئەمە **پاداشتی کەسێکە کە وازی لە کیتاب و سوننەت هێناوە، وە کەلام ی قبوڵ کردووە**) .

**(ذم الكلام : ٧٠٨)**

**٣٣ - عبدالله بن داود الخريبي (٢١٣ هـ) ئەڵێ :**

(دین بە کەلام نیە، بەڵکو دین بە ئاثارە) .

**(ذم الكلام : ١٠٦٧)**

**٣٤ - أحمد ابن الوزير القاضي ئەڵێ :**

(بە عمر الضّرير (**٢٢٠** هـ) م وت پیاو فێری شتێک ببێت لە کەلام ڕەددی ئەهلی جەهلی پێبداتەوە؟

وتی : (**کەلام هەمووی جەهلە**، فێری جەهل مەبە، لەبەرئەوەی **هەرکات بە جەهل عالم بووی، ئەوا بە عیلم جاهیل ئەبیت)** .

**(مختصر الحجة : ٢٣٤)**

**٣٥ - علي بن خشرم ئەڵێ :**

بشر بن الحارث (**٢٢١** هـ) بۆی نووسیم : (پێچەوانەی پێشەوایان مەکە، لەبەرئەوەی **خاوەنی کەلام هەرگیز سەرفراز نابێت)** .

**(ذم الكلام : ١١٨٠)**

**٣٦ -** پیاوێک بە **أبي عبيد القاسم بن سلام (٢٢٤** هـ) ی وت چی ئەڵێیت دەربارەی هاوەڵانی کەلام؟

أبو عبيد وتی : بەڕاستی الله بەڵگەی نیشانداوی لەسەر ڕێی هیدایەت، وە ڕێبازی حەق | **فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ** | **(النساء : ٥٩)**، ئایا

چیت پێیە لەوەی بەڵگەی لەسەر بێت لەلایەن پەروەردگارتەوە لە کەلامەکەی وە سوننەتی پێغەمبەرەکەی کە وات لێ ئەکەن بگەڕێیتەوە بۆ ڕا و عەقڵی خۆت؟ الله ڕێگری لێکردووی لە کەلام لە زاتی خۆی و صیفەتەکانی ئیللا هێندەی ئەوە نەبێت کە بۆی باس کردوویت، الله ئەفەرموێ : | وَإِذَا رَأَيْتَ ٱلَّذِينَ يَخُوضُونَ فِيٓ ءَايَٰتِنَا فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ | (الأنعام : ٦٨) .

وە ئەفەرموێ : | وَيَعْلَمَ ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ فِيٓ ءَايَٰتِنَا مَا لَهُم مِّن مَّحِيصٍ | (الشورى : ٣٥) .

وە ئەفەرموێ : | إِنَّ ٱلَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِيٓ ءَايَٰتِنَا لَا يَخْفَوْنَ عَلَيْنَآ | (فصلت : ٤٠).

(مختصر الحجة : ٦٩٣)

---

: هەڵوێستەیەک لەسەر فەرمایشتی الله | فَإِن تَنَٰزَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ | (النساء : ٥٩) .

ئەگەردوو موسڵمان لە بابەتە فرۆعیەکاندا حوکم نەبەنەوە بۆلای قورئان و سوننەت و نەیکەن بە حەکەم لە نێوان خۆیاندا ئەوا ڕاستەوخۆ خەواریجەکان تەکفیریان ئەکەن و ئەڵێن ئەبێت لە شتێکدا ڕاجیاوازی درووست بوو بگێڕدرێتەوە بۆ لای الله و رسول ﷺ، ئێمەش ئەڵێین بەڵێ وایە، بەڵام ئایا بابەتە ئەصلیەکان ئەولاترن بگێڕدرێنەوە بۆ لای الله و رسول ﷺ یان بابەتە فرۆعیەکان؟ بێگومان بابەتە ئەصلیەکان کە ئیمام و پێشەوا جەهمیەکانتان لە بابەتانێک کە پەیوەندی بە تەوحید و سوننەتەوە هەیە ئەگەڕێنەوە بۆلای فەلسەفەی کەلامی یۆنان و هیند وە کوفرو زەندەقە ئەنجام ئەدەن، ورد بەرەوە لەم وتەیەی

ابن قیم ئەوکات بۆت دەرئەکەوێت ئەوانەی شەو و ڕۆژ جۆرەها ناووناتۆرە لە ئەهلی سوننە ئەنێن بەهۆی بیروباوەڕیان لە بابەتی حکم و تحاکم دا چ کەسانێکی دوو ڕوون .

ابن القیم دەربارەی ئەشعەریەکان ئەڵێ :

ئەوانەی قورئانیان پێ بەس نەبوو تاکو بە بڕوای خۆیان ڕێگای عەقڵیان گرتە بەر، بە عەقڵ دژایەتی قورئانیان کرد و عەقڵیان پێشی قورئان خست، جا ئەمانە لە جۆری ئەوکەسانەن کە الله-یان پێ بەس نیە تاکو هاوتا و هاوبەشیان بۆی داناوە ئەیپەرستن هەروەک چۆن الله ئەپەرستن، بەڵکو ئەمانە شەریکەکانیان پێشی الله نەخستووە، ئەمانە هاوتایان بۆ الله داناوە گوێڕایەڵی ئەکەن و گەورەی ئەکەن و ئەیپەرستن هەروەک چۆن الله بە گەورە ئەزانن و ئەیپەرستن، بەڵام ئەمانەی عەقڵیان پێشی قورئان خستووە هاوتایان بۆ کتێبی الله داناوە حوکم بۆلای ئەبەنەوە و حوکمی ئەوپێش ئەخەن بەسەر حوکمی قورئان، بەڵکو ئەم دوو شتە پەیوەستن بەیەکەوە، هەرکەسێک قورئان بەس نەبێ بۆی ئەوا الله-ش بەس نیە بۆی، جا هەرکاتێک هاوتای بۆ قورئان دانا ئەوا هاوتای بۆ الله داناوە، جگە لەمە هیچ شتێکی تر نیە بەهیچ جۆرێک) .

**(الصواعق المرسلة : ١٣٥٣)**

## ٣٧ - أحمد بن حنبل (٢٤١ هـ) ئەڵێ :

**(خاوەنی کەلام هەرگیز سەرفراز نابێت، وە کەسێک نابینرێت سەیری کەلام بکات ئیللا لە دڵیدا گوومان هەیە) .**

**(جامع بيان العلم وفضله : ١٧٩٦)**

**٣٨ - أحمد بن حنبل** ئەڵێ :

(**خاوەنی کەلام** سەرفراز نابێت، هەرکەس کەلامی وەرگرت خاڵی نابێت لەوەی کە نەبێت بە **جەهمی**) .

**(الإبانة الكبرى : ٤٠٣)**

**٣٩ - أحمد بن حنبل** ئەڵێ :

(هەرکەس کەلامی وەرگرت خاڵی نیە لە بیدعە) .

**(طبقات الحنابلة : ١٤٩/١)**

**٤٠ - أحمد بن حنبل** ئەڵێ :

(**لەگەڵ هاوەڵانی کەلام دامەنیشن**، ئەگەرچی توابێبتیشنەوە لە سوننەتدا، کارەکانیان بۆ لای خێر ناچێت) .

**(ذم الكلام : ١٢٧٣، طبقات الحنابلة : ٤٠٥/٢)**

**٤١ - أحمد بن حنبل** ئەڵێ :

(هیچ کەسێکم نەبینیوە طەلەبی کەلام بکات و حەزی بۆی بچێت ئیللا دەرچووە لە سەر کارێکی گەورە، قسەیان کرد بە شتانێک و بۆی چوون کە **دڵم هەڵی ناگرێت و زمانم نایەتە گۆ کە باسی بکەم**) .

**(الإبانة الكبرى : ٤٣٣)**

---

: و اتە هێندە قسە وکوفرەکانیان گەورەیە ئیمام أحمد ئەڵێت زمانم نایەتە گۆتا بیلێم.

## ٤٢ - أحمد بن حنبل ئەڵێ :

(هەرکەس حەزی بۆ کەلام بچێت ئەوا لە دڵی دەرناچێت) .

(الإبانة الكبرى : ٦٧٥)

---

: مەبەستی ئیمام ئەوەیە هەرکەس شوێن جەهلی کەلام بکەوێت زۆریان کەم ئەگەر تەوبەش بکات ئەوا کەمێکیش بێت لەو جەهلی کەلامەی تیا ئەمێنێتەوە چونکە سرووشتی جەهلی کەلام وەک مادده هۆشبەرەکان و ایە خاوەنەکەی پێوەی سەرقاڵ ئەبێت ئەگەر پێی خۆش بێت یان نا جا باشترین کارئەوەیە بە بچوکترین سەیرکردنیش سەیری نەکرێت والله أعلم .

## ٤٣ - أحمد بن حنبل ئەڵێ :

(زانایانی کەلام زەندیقەکانن) .

(تلبيس إبليس : ص - ٨٣)

## ٤٤ - عبدالله بن أحمد بن حنبل ئەڵێ :

(باوکم بۆ عبيدالله بن يحيي بن خاقان ی نووسی: تۆ هاوەڵی کەلام نيت، وە کەلام نابينم لە شتێک لەمەدا، جگە لەوەی لە کيتابی الله هەيە يان حەديثی رسول الله، ئەمما غەيری ئەوە کەلام تيايا شتێکی باش نيە) .

**(ذم الكلام : ١١٧٣)**

## ٤٥ - المروزي (٢٧٥ هـ) ئەڵێ :

(بە أبي عبدالله وترا کە پياوێک قسەی کردووە بە کەلام پياوێک لە ئەهلی سوننەش ڕەددی داوەتەوە بە قسەيەکی داهێنراو، أبو عبدالله تووڕە بوو، وە نکۆڵی لەسەر هەموويان کرد، وە وتی: داوای لێخۆش بوون ئەکات پەروەردگاری ئەو کەسەی بە شتێکی داهێنراو ڕەددی داوەتەوە.

وە وتی : هەرکاتێک پياوێک بيدعەيەک دائەهێنێت فراوانی ڕووئەدات لە وەڵامەکەی) .

**(السنة الخلال : ٢١٤٨)**

---

**: واتە کاتێک پياوێک بە بيدعەيەک ڕەددی بيدعەيەکی تر ئەداتەوە ئەوا خەڵکی بيدعەی زياتر فێرئەبن و بيدعەکان فراوانترئەبن لەجياتی ئەوەی کەم ببنەوە والله أعلم .**

**٤٦ - الفضل بن زياد** ئەڵێ :

(پرسیارم لە أبا عبدالله أحمد بن حنبل کرد دەربارەی الکرابیسي و ئەوەی دەری خستووە؟ دەموچاوی گرژ کرد دواتر وتی: ئەو بەڵایانە لەو کتێبانەوە هاتوون کە دایاننناوە، وە وەزیان لە ئەثەری رسول الله ﷺ و هاوەڵانی هێناوە، وە ڕوویان کردە ئەو کتێبانە) .

**(مختصر الحجة : ٥٩٨)**

---

**: مەبەستی لە کتێبەکانی جەهلی کەلام ە .**

**٤٧ - أبو الحارث** ئەڵێ :

(پرسیارم کرد لە أبا عبدالله وتم لێرە پیاوێک هەیە مونازەرە لەگەڵ جەهمیەکان ئەکات، وە هەڵەکانیان دەرئەخات، وە بابەتە ناڕوونەکان ڕوون ئەکاتەوە، ئایا چی ئەڵێیت دەربارەی؟

وتی : وای نابینم قسە بکرێت لە شتێک لەم هەواوئارەزووانە، وە وای نابینم کەس مونازەرەیان لەگەڵدا بکات، ئایا معاوية بن قرّة نەیوتووە: مشتومڕ کارەکان پوچەڵ ئەکاتەوە، وە **کەلام تێکدەرە خێر ناهێنێت، وە خاوەنی کەلام سەرفراز نابێت، دووربکەرەوە لە هاوەڵانی دەمەدەمێ و کەلام، پابەند بە بە سوننەتەکانەوە، وە ئەوەی ئەهلی عیلمی پێش خۆت لەسەری بوون، ئەوان**

**ڕقیان لە کەلام و ڕۆچوون لەگەڵ ئەهلی بیدەع و دانیشتن لەگەڵیان بووە،** سەلامەتی لە وازهێنان لەوەدایە، فەرمانمان پێنەکراوە بە دەمەدەمێ و مشتومڕ لەگەڵ ئەهلی گومڕایی، بۆ ئەوەی سەلامەت بیت لێی) .

**(الإبانة الكبرى)**

**٤٨** - **ابن أبي حاتم** ئەڵێ :

(گوێم لە باوکم (**٢٧٧** هـ) و أبا زرعة (**٢٦٤** هـ) بوو کە فەرمانیان ئەکرد بە هەجرکردنی ئەهلی زەیغ و بیدەع، وە توند بوون لەوەدا بە توندبوونێکی زۆر، وە نکۆڵیان ئەکرد لەو کتێبانەی دانراون بە ڕەئی بەبێ ئاثار، وە ڕێگریان ئەکرد لە دانیشتن لەگەڵ **ئەهلی کەلام** و **سەیرکردنی کتێبەکانی موتەکەلیمین**، وە ئەیانوت **خاوەنی کەلام هەرگیز سەرفراز نابێت)**.

**(شرح اعتقاد أهل السنة اللالكائي : ٣٢٢)**

**٤٩** - **محمد بن عقيل بن الأزهر** ئەڵێ :

(پیاوێک هاتە لای المزني (**٢٦٤** هـ)، پرسیاری لێکرد دەربارەی شتێک لە کەلام، وتی: من ڕقم لەمەیە، بەڵکو ڕێگری لێئەکەم).

**(ذم الكلام : ١٢٢٥)**

**٥٠ - ابن قتيبة (٢٧٦ هـ)** ئەڵێ :

**(کەلام ئیشی ئێمە نیە، وە پێم وایە زۆربەی بەهیلاکچووەکان بە هیلاک نەچوون ئیللا بەهۆی کەلامەوە نەبێت) .**

**(الاختلاف في اللفظ والرد على الجهمية)**

**٥١ - الجنيد بن محمد ناسراو بە الجنيد البغدادي (٢٩٨ هـ)** ئەڵێ :

**(کەمترینی کەلام شکۆی پەروەردگار لە دڵدا ئەخەن،** دڵ کاتێک داماڵرا لە شکۆی پەروەردگار، دائەماڵرێت لە ئیمان).

**(ذم الكلام : ١٢٤١)**

---

**: ڕاستی فەرموو، چونکە لەلای ئەهلی کەلام الله تعالی وجوودێکی حەقیقی نییە، الله ی ئەهلی کەلام تەنها خەیاڵاتێکە بەس، چونکە هەموو ئەو سیفەتانەی الله تعالی بۆ خۆیی جێگیرکردووە لە قورئانەکەی و لەسەرزمانی پێغەمبەرەکەی ، ئەهلی کەلام پەکی ئەخەن و کافرن پێی .**

**٥٢ - البربهاري (٣٢٩ هـ)** ئەڵێ :

(ئەگەر ویستت بەردەوام بیت لەسەر ڕێگای حەق و ڕێبازی ئەهلی سوننەی پێش خۆت، **وریای کەلام و هاوەڵانی کەلام** و دەمەدەمێ و مشتومڕ کردن و

قیاس بە، گوێگرتن لێیان ئەگەرچی لێشیان قبوڵ نەکەیت گومان ئەخاتە دڵتەوە، وە بەس ئەوەندەی قبوڵی بکەیت **تیا ئەچیت**، هەرگیز زەندەقە و بیدعە و هەوا و ئارەزوو و گومڕایی نەبووە ئیللا لە **کەلام** و دەمەدەمێ و مشتومڕ و قیاس نەبێت، ئەوانە دەرگای **بیدەع** و **گومانەکان** و **زەندەقە ن**) .

**(شرح السنة : ١٥٣)**

**٥٣ - بە أبي سهل الإسفراييني (٣٧٠ هـ)** وترا ئەمانەوێت فێری کەلام ببین بۆ ئەوەی شارەزای دین ببین، تورە بوو وتی: ئەوە سەلەف لە زانایانمان کافر بوون؟

**(ذم الكلام : ١٢٧٣)**

---

**: واتە گەربە قسەی ئێوە بێت مادام سەلەف جەهلی کەلامیان نەزانیوە ئەوا شارەزای دین نەبوون و کافربوون والله أعلم .**

**٥٤ - أبو زيد المروزي (٣٧١ هـ)** ئەڵێ :

(چوومە لای أبا الحسن الأشعري لە بەصرە، شتێک لە کەلامم لێوەرگرت، لە خەوما بینیم وەک ئەوەی کوێر بووبم، ئەمەم گێڕایەوە بۆ خەولێکدەرەوەیەک، وتی تۆ عیلمێکت وەرگرتووە کە پێی گومڕا ئەبیت، دەستم هەڵگرت لە الأشعري، دوای ڕۆژێک لەسەر ڕێگا بینیمی، پێی وتم ئەی أبا زید پێت

ناخۆشە بگەڕێیتەوە بۆ خوراسان عالم بیت بە فرۆع - فیقهـ - و جاهیل بیت بە ئوصول - بیروباوەڕ - .

خەوەکەم بۆ گێڕایەوە، وتی لێرە قسەم لەسەر مەکە).

**(ذم الكلام : ١٢٧١)**

---

**: لەلای ئەهلی کەلام لە جەهمی و موعتەزیلە و ئەشعەری و ماتوریدیە جەهمیەکان عەقیدە و بیروباوەڕکە خۆیان بە ئوصول ناوی ئەبەن لە جەهلی کەلام وەریئەگرن، وە پێیان وایە هەرکەسێک شارەزای جەهلی کەلام نەبێت شارەزای ئوصول نییە، لەکاتێکدا زانایانی سەلەف رحمهم الله هیچیان زانا نەبوون بە جەهلی کەلام و بگرە بە سەرچاوەی هەموو بیدعە و کوفر و زەندەقە و پەکخستنێکیان زانیوە .**

## ٥٥ - ابن منده (٣٩٥ هـ) ئەڵێ :

(پیاو بترسێت و پەند وەربگرێت لەو کەسانەی پێشی کەوتن کە قسەکردن بە لەفظ مەزهەب و وتەیان بووە، کە چۆن دەرچوون لە دونیا بە هەجرکراوی و زەمکراوی لە وڵات و مەجلیسەکاندا، لەبەر ئەو بیروباوەڕە قێزەون و وتە پیسەیانەوە کە پێچەوانەی دینی اللّه بوو، وەك **الكرابيسي** و **الشواط** و **ابن كلّاب** و **الأشعري** و نمونەکانیان لەوانەی دەمەدەمێ و **کەلام** ڕێگایان بووە لە دینی اللّه).

(ذم الكلام : ١٣٤٥)

٥٦ - معمر بن أحمد الأصبهاني (٤١٨ هـ) ئەڵێ :

(لە سوننەتە وازهێنان لە ڕەئی و قیاس لە دیندا، وە وازهێنان لە دەمەدەمێ و مشتومڕ، وە وازهێنان لە باسەکانی قەدەر و قیاس و **هاوەڵانی کەلام**، وە وازهێنان لە سەیرکردنی **کتێبەکانی کەلام** و کتێبەکانی ئەستێرەکان، ئەمە ئەو سوننەتەیە کە ئوممەت لەسەری کۆکن).

(الحجة في بيان المحجة : ٢٣٦/١)

٥٧ - أبا بكر بن بسطام ئەڵێ :

(پرسیارم کرد لە أبا بکر بن سیار دەربارەی ڕۆچوون لە کەلامدا، **ڕێگری لێکردم دەربارەی بە توندترین ڕێگری، وە وتی پابەند بە کیتاب و سوننەتەوە وە ئەوەی سەردەمی یەکەم لەسەری بوون لە هاوەڵان وە تابعین و تابعی تابعین، من ئەمبینی موسڵمانان لەمسەر و ئەوسەری زەوی ڕێگریان ئەکرد لەمە و نکۆڵیان ئەکرد لێی، وە فەرمانیان ئەکرد بە کیتاب و سوننەت)** .

(ذم الكلام : ١٢٦٤)

٥٨ - أبا يعقوب بن زوران ی فەقیهـ موفتی حەرەمی مەککە ئەڵێ :

(وەڵامی پرسیارێکم دایەوە لە کەلامدا، گەڕامەوە بۆ ماڵەکەم و هیچ شتێک لە دڵما نەمابوو لەو شتانەی کە الله منەت ئەکاتە سەر ئیمانداران پێی،

تا هەستام، خۆم شۆرد، سەجدەم برد، خۆم زەلیل کرد، وە تەوبەم کرد، وە گریام تا وەڵامم درایەوە).

(ذم الكلام : ١٢٨٤)

**٥٩ - إبراهيم الخواص** ئەڵێ :

(زەندەقە و **کوفر** و **بیدعە** و **جورئەت** نەبووە لە دیندا ئیللا لە ڕوانگەی **کەلام** و دەمەدەمێ و مشتومڕ و سەرسام بوونەوە نەبێت، چۆن پیاوێک جورئەت ئەکات لەسەر دەمەدەمێ و مشتومڕ، وە الله تعالى ئەفەرموێ : | **مَا يُجَٰدِلُ فِيٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ** | (غافر : ٤).

(ذم الكلام : ١٢٨٧)

**٦٠ - أحمد بن حمزة** و **أبا علي الحداد** ئەڵێن :

(أبا العباس أحمد بن محمد النهاوندي مان بینی لەسەر **نکۆڵیکردن لەسەر ئەهلی کەلام و بەکافردانانی ئەشعەریەکان**، وە باسی شکۆ گەورەکەیان کرد لە نکۆڵیکردن لەسەر أبي الفوارس القرماسيني وە هەجرکردنەکەی لەبەر یەک وشە).

(ذم الكلام : ١٢٩٥)

**٦١ - سهل بن محمد الصعلوكي** ئەڵێ :

**(کەمترینی کەلام لە خەسارەتمەندیەوەیە، شکۆی الله لە دڵدا ئەخات).**

(ذم الكلام : ١٢٩٩)

## ٦٢ - عبدالرحمن بن محمد بن الحسين ئەڵێ :

(أبا حامد الإسفراييني و أبا الطيب الصعلوكي و أبا بكر القفال المروزي و أبا منصور الحاكم م بينى لەسەر **نكۆڵیكردن لەسەركەلام و ئەهلەكەی**) .

(ذم الكلام : ١٣٠٣)

## ٦٣ - محمد بن عبدالرحمن الدباس ئەڵێ :

(أبا منصور الحاكم م بينى لەبەردەمیدا شتێک لە کەلام باسکرا، پەنجەی خستە گوێیەوە.

(ذم الكلام : ١٣٠٨)

## ٦٤ - يحيى بن عمار (**٤٢٢** هـ) ئەڵێ :

(عیلمەکان پێنجن: عیلمێک کە ژیانی دینە ئەویش عیلمی تەوحیدە، وە عیلمێک کە قوتی دینە ئەویش یاد و ئامۆژگاریە، وە عیلمێک کە چارەسەری دینە کە ئەویش فیقهە، وە عیلمێک کە نەخۆشی دینە ئەویش هەواڵەکانی فیتنەی سەلەفە، **وە عیلمێک کە لەناوبەری دینە ئەویش کەلام و باسکردنی ئەستێرەکانە**).

(ذم الكلام : ١٣١٣)

٦٥ - الحسن بن أبي أسامة المكي ئەڵێ :

(گوێم لە باوکم بوو ئەیوت: لەعنەتی الله لە أبا ذر، یەکەم کەس بوو کەلامی هێنایە حەرەمەوە، وە یەکەم کەس بوو کە لە مەغاریب بڵاوی کردەوە).

(ذم الكلام : ١٣١٦)

٦٦ - الحسن بن هانئ ئەڵێ :

(هەمووومان کەلاممان خوێند، بەڵام عاقڵ بووین دەستمان لێ هەڵگرت، أبو الجود و الديناري گەمژە بوون، ڕیسوای کردن - واتە جەهلی کەلام وای لێ کردن ڕسوا بین - ) .

(ذم الكلام : ١٣١٩)

---

: والله أعلم لەو شوێنەی ئەوان خوێندنی جەهلی کەلام و مەنطق باو بووە وەکو حوجرەکانی کوردوستان، هەربۆیە خوێندوویانە، بەڵام پاش ئەوەی پووچیەتی جەهلی کەلام و مەنطق یان بۆ دەرکەوتووە وازیان لێهێناوە .

٦٧ - طاهر بن محمد المالیني ئەڵێت :

(سالم هات بۆ تۆبەکردن، یحیی بن عمار ڕازی نەبوو و بە دەرگاوانەکەی وت : (کتێبە کەلامیەکان بهێنە تا بە ئاگر بیسووتێنین) .

(ذم الكلام : ١٣٢٣)

٦٨ - عبدالرحمن بن حسن آل الشيخ (١٢٨٥ هـ) ئەڵێ: عیلمی مەنطیق - واتە کەلام - حەرام کراوە لەبەر ئەم هۆکارانە :

یەکەم : **لە عیلمەکانی شەریعەتی محمدی نیە، بەڵکو لە عیلمەکانی یۆنانە**، وە یەکەم کەس دایهێنا المأمون کوڕی هارون الرشید بوو، وە ئەمما لە خیلافەتی پێش خۆی لە خوارینەکانی بني العباس وە پێش ئەوانیش خەلیفەکانی بني أمية ناسراو نەبووە لە سەردەمیاندا.

دووەم : **پێشەوایانی تابعین لە فەقیهـ و فەرموودەناس و موفەسیرەکان ئەم عیلمەیان نەزانیوە، وە ئەوان گوێزەرەوەی عیلم بوون، وە ئیسلام لە سەردەمی ئەواندا دەرخراو بوو، وە عیلمە بەسوودەکان زۆربوو لایان**، ئەوە نەبووە لە کتێبەکانیان - واتە جەهلی کەلام و مەنطیق - .

سێیەم : **ئەم عیلمە جەهمیەکان دایانهێنا، کاتێک ئیلحادیان کرد لە ناو و صیفەتەکانی الله**، وە دەستپێشخەریان کرد بۆ المأمون لەسەر بە عەرەبی کردنی کتێبەکانی یۆنان، فیتنەی جەهمیەکان گەورە بوو، وە بیدعەکەیان دەرکەوت بەم هۆیەوە، زەرەرەکەی زیاتر بوو لە قازانجەکەی، وە پێویستە زانایان وازی لێبهێنن و لای لێنەکەنەوە، وە پشت ببەستێت بەوەی لە کیتاب و سوننەت هەیە وە ئەوەی سەلەف و پێشەوایان لەسەری بوون، وە کتێبەکانیان بەردەستە و سوپاس بۆ الله **هیچ شتێک لە گومانەکانی ئەهلی مەنطیقی تیا نیە**، ئا بەمە دینداری الله ئەکەین .

**(الدرر السنية : ١/٣٣٨)**

---

**: جەهلی الکلام و منطق هیچ پەیوەندی بە موسوڵمانانەوە نییە، بەڵکو عیلمی یۆنان و کافرەکانە، وە جەهمی و ئەشعەری و ماتوریدیە جەهمیەکانیش عەقیدەی خۆیانیان لەسەر دامەزر اندووە و لەپێناویدا قورئان و فەرموودە بەدرۆ ئەخەنەوە و سەری ئەخەن بەسەریدا .**

## ٦٩ - عبداللطيف بن عبدالرحمن آل الشيخ (١٢٩٣ هـ) ئەڵێ :

(کاتێک خەڵکی ڕۆچوون لە عیلمی کەلامدا، وە کتێبەکانی یۆنان کرانەوە بە عەرەبی، بەم هۆکارە ڕۆچوون و دەمەدەمێ ڕوویدا لە صیفەتەکانی الله کە کتێبەکان پێوەی هاتوون، وە پێغەمبەران هەواڵیان داوە، ئەوەی زۆرینەی خەڵکی واجب کردووە بوونی **زاتی الله و پەروەردگارێتیەکەی پەکبخەن** وەک ئەوەی ڕوویدا لەلای ئیتیحادی و حلولیەکان، **لە ڕێگای کەلام و مەنطیق چوونە ناو ئەو کوفرو بوهتانە قێزەونانەوە)**.

**(الرسائل والمسائل النجدية : ٣/٣٤٥)**

*ئەو وتەیانەی نەهێنراون لەم نامیلکەدا زۆر زیاترن لەوەی کە هێنراوە*

**والحمدلله رب العالمين**